# شیعری کوردی پاش نالی-پاش مەولەوی

## (خوێندنەوەیەکی ئەدەبی - بەراوردکاری)

**عادڵ محەمەدپوور**
**(مەریوان)**

**پوختەی وتار**

شیعری کوردی هۆرامی لە نەفەسێکی بەردەوام و پرۆسەیەکی نەپساو و یەک چەشنی (١٤٠٠) ساڵە پێکهاتووە کە تا وەک ئەمێستاکە بە شێوەیەکی دیالێکتیکی بەردەوامی بە خۆیەوە گرتووە، ڕەنگە وەک هەر ڕەوتێکی ئەدەبی، بەرز و نەوی بە خۆیەوە بینیبێت، بەڵام لە هیچ سەردەمێکدا، نە پووکراوەتەوە و نە کۆتایی پێهاتووە و ئێستاش لە دوو شێوازی «کلاسیک» و «ئەمڕۆ»دا بەردەوامە و شاعیران خەریکی ئەزموونی داهێنانن، ئەمەش وێنایەکی سروشتی و هارمۆنیاییە بۆ ئەو ڕەوتە شیعرییە. قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردی کرمانجی خواروو، بە تەنیا و بە بێ پشتیوانی گەنجینەیەکی دێرینە و دەوڵەمەندی شیعری پێش خۆی و بە بێ کاریگەری لەسەر شیعری نوێ، سەری هەڵداوە و درەوشاوەتەوە و دەوامی کردووە.

**سەر وشە**

نالی، پاش نالی، مەولەوی، پاش مەولەوی، هەناسەی بەردەوام، گۆڕان، بادانەوە، ململانێی سیاسی، تەوسە شیعر، زوان پاراوی و...تاد.

**وەڵێنە(١)**

مێژوو تەنیا ناسکارێکە کە پێمان دەڵێ هیچ دیاردەیەک لەم کەونەدا چەقبەستە و نەگۆڕ نەبووە، بەڵکو هەموو دیاردەیەکی جیهان بە پێی یاسای (دیالێکتیک)(٢) وا لە حاڵی گۆڕانکاریدایە، ئەم یاسا بزاوتووە لە هەموو شت و ئۆبژەکاندا، کاریگەری و کاردانەوەی هەبووە. دیارە شیعر و ئەدەبیش لەم یاسایە قوتار ناکرێت، بە تێپەڕبوونی دۆخی زەمان، دەقەکان گۆڕانکارییان بەسەر دێت و دەبنە خاوەن ڕەوت و قۆناغ و چییەتی خۆیان. بەپێی هەلومەرج و دۆخی کۆمەڵگەش، ئەم قۆناغ بۆ ئەو قۆناغ، جیاوازییەکی ئەوتۆ بە خۆیەوە دەبینێ. هەر بەم بۆنەوە لە دیدی «شێوازناسی بەیان»دا باسگەلێک بە کارکردی «بەرجەستەبوونی ڕێسای ئەدەبی»، دێنە نێو بازنەی گۆڕانکارییەوە کە دەکرێت شێوازناس و تۆژکاری ئەدەبی بە چاوی بەراوردکاری لێکیان بداتەوە، ئەوەش خستنە ڕووی هەندێ توخمی زوانی، ئەدەبی و فیکرییە بە ناو «ڕێسا» و «شێوازی تاکی» و...تاد تەتڵە و هەڵاوێردنی ئەم باسگەلە دەبنە هۆی «جیاوازی»، یان «هاوچەشنی» شێواز کە لە شیعری شاعیران و لە ڕەوڕەوەی مێژووی قۆناغەکانی ئەو شیعرەدا باسیان لێوە دەکرێت.

پشت بەستن بەو پێودانگە شێوازناسییە و دەرک کردن بە دیاردەی جیاوازییە فرەچەشنەییەکان و خوێندنەوەی» واقیعییانەی ڕەوتی زوان، شیعر و ئەدەبی نەتەوەیی



نالی

کوردی، ئەرکێکی هەنووکەیی بە هەژمار دێ. لەم ڕووکردەدا بۆمان دەردەکەوێ کە وێڕای هەبوونی ئەو «ڕێسا» جیاوازییانە، هەر هەیکەلی ڕەنگین و جوانخاس دەنوێنێ، ئەمە تاکە ڕێگایە کە بۆ خوێندنەوەی زانستی- سەردەمیانەی واقیعی زوان و ئەدەبی کوردی.

(عەلی حەریری١٠١٠- ١٠٧٠ز، فەقێ تەیران ١٣٠٧- ١٣٧٥ز، مەلای جزیری ١٤٠٧- ١٤٨١ز، ئەحمەدی خانی ١٦٥٠- ١٧٠٦ز و...تاد) لە باکوور، (سالم (١٨٠٠- ١٨٦٦)، کوردی (١٨٠٩- ١٨٤٩)، مەحوی (١٨٣٠-١٩٠٤)، حەریق (١٨٥١-١٩٠٧)، ئەدەب (١٨٥٩- ١٩١٢)، حەمدی ساحێب قەران (١٨٧٦- ١٩٣٦)، حاجی قادری کۆیی()، ناری (١٨٧٤-١٩٤٤)، زێوەر (١٨٧٥- ١٩٤٨) پیرەمێرد (١٨٦٧- ١٩٥٠)، گۆران (١٩٠٤- ١٩٦٢ز)، و...تاد لە باشوور، بێسارانی (١٦٤١- ١٧٠٢ز)، صەیدی (١٨٢٠- ١٨٨٦ز)، مەولەوی تاوەگۆزی «١٨٠٦- ١٨٨٢ز»، خانای قوبادی (١٧٠٠- ١٧٥٩ز) مەلا هەسەن دزڵی (١٨٩٦- ١٩٨٥ز و...تاد) لە هۆرامان، شاکە و مەنسوور ١٧٢٦- ١٧٩٨ز) لە گۆران...، ئەڵماس خان کەنوڵەیی(سەدەی١٩ز)، شامی کرماشانی لە کەڵهوڕ و...وێنایەکن لەم فرە چەشنییە و بەیانکەر و پێناسەی چییەت و هەبوونی جوانخاسی هەیکەلی ڕەنگاڵەی نەتەوەیەک بە ناوی کورد. لەم پێکهاتە فرە چەشنییەدا، یەک خاڵ دەبێتە گرێبەستی بنەمای هاوچەشنی و هاو ڕەگەزی ئەم نەتەوە، ئەویش ڕەگ داکوتانە لە ناخۆئاگای کۆیی زوان و ئەدەبیی نەتەوەیی کە خۆی بۆ خۆی فاکتێکە بۆ ژێرخانی چییەتی و شوناسێک بۆ دیاردەی کورد بوون.

## شیعری کوردی هۆرامی خاوەن هەناسەیەکی بەردەوام و ئاخێزگەی مێژووی گۆڕانکاری ئەدەبی کوردی

لەم پەیکەرە ڕەنگینەدا زوان و شیعری کوردی هۆرامی خاوەن گەنجینەیەکی دێرینەترە کە ئەگەر نازناوی ئاخێزگەی ڕەسەنایەتی، زوان و ئەدەبیاتی کوردی بۆ نێوزەد بکەین، بە هەڵەدا نەچووین. بژاقمەندی و هەناسەی یەک چەشن و بەردەوام، پەسەندی زیهنی جەماوەر و چینی دەستەبژێر و خاوەن ویر، ساکاری، ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی لە تەشک و دڵێنەدا(٣)، لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەم ڕەوتە لە حەوت قۆناغدا(٤)، بە ئەژمار دێن.

## ڕەوشی بابەتی - زانستی و خوێندنەوەی ڕەوتەکان و ئەرکێکی هەنووکەیی

یەک لە خەسارە مەزنەکانی پانتایی مێژووی ئەم ئەدەبە، ئەوە بووە کە یان هەر کار نەکراوە، یان ئەگەر کراوە شەقڵی ڕەهەندێکی زانستی- توێژکارییان کەمتر پێوە دیار بووە، (٥) خستنە گەڕ باسگەلێکی ئەدەبی ئەویش دوو چەشنی جیاواز و لێک ئاوێزکردنیان بە بێ پاڵپشتی پێوەندی واقیعەکان و دۆزی گۆڕانکاری«تحول» بێ گومان، پۆلێ پرس و هەندێ باسی گوماناوی و ئاڵۆز و دژنوما (پارادۆکس) بۆ بەردەنگ دروست دەکات کە پێویستی بە تاووتوی بابەتی- زانستی زیاتر دەبێ، بۆیە نووسەری ئەم دێڕانە لەم بەستێنەدا، لەو ڕووکردە دژوازانە بە باشی کۆڵراوەتەوە و ئەنجامەکەش ئەم وتارەیە کە ئاراستە دەکرێ.

من پێم وانییە کەس مافی دەرخستنی ڕوانگەی خۆی نەبێ، بە پێچەوانەوە داکۆکی لەسەر ئەم گوزارە دەکەم کە هەر کەسێک بۆی هەیە دەست بۆ بنکەی فرە چەشنەی ئەدەب و شیعر ببا، بە ڕەوشتی زانستی - تەحقیقی لەم خوانە بەهرە ببات، یان پشک و داهێنانی خۆی بخاتە سەر خوانەکە. کێشەی من تەنیا بۆ نەبوون، یان «هەژاری ڕەوش» و ئەنجامی ڕەهاخوازی (موتلەق گەرایی)

بابەتەکـانە و ئەرکی هەر ڕەخنەگـرێکە کـە ئاوڕ لەم دیاردەیە بداتەوە. ئەم نووسـراوەی منیش لەم یاسـایە بەدەر نییە، ئەو مافەی بۆ ئەوی تر پارێزراوە کە مادام شـەقـڵی پێـوەر و ڕەوشی شـرۆڤـە و هەڵسـەنگاندنی زانسـتی و دۆزی نووسـینی پێـوە دیار نەبێ، ئەوە بە بێ لێبوردن و چاوپۆشی کردن بخرێتـە ژێر تیـخی ڕەخنە و لۆقەت گرتن، زۆریش خوشحاڵ دەبم.

### نالی – پاش نالی و مەولەوی – پاش مەولەوی و ڕاڤەکارییەکی بەراوردیانە

ا) قوتابخانەی نالی بۆ و لە چ هەلومەرجێکدا سەری هەڵدا؟ بۆ بوو بە ئاخـێزگەی درەوشانەوەی بەشـێک لە جـوگـرافـیـای زوان و شـیـعـری کـلاسـیکی کـوردی؟ کاریگەرییەکانی لەسەر شیعری کرمانجی خواروو چی بوون؟

ب) لە شیعری هۆرامی، ئەو هەناسەی لە هورمزگانەوە سەری هەڵدابوو، پاش مـەولەوی بەردەوام دەبێ، یان لە لێدان دەکەوێ؟.

ج) بۆ کۆرپەلەی نوێخوازی شیعری کوردی سۆرانی لە سینگی نالی– پاش نالی گۆچ نەکرا؟

د) ئەی بۆ فـەلسـەفـەی نوێخـوازی گـۆران لە جەرگەی(قوتابخانەی هۆرامی)، ڕسکا، پاشان تیوریزە و فراژۆێ بوو؟

ئەم پرسە دژوازانەی کە وروژراون، دەمەوێ لەم وتارەدا بە پێودانگی ئەدەبی بەراوردکاری وەڵامیان بدەوەمەوە.

١) کە باسی شیـعری کـلاسیکی کوردی دەکـرێ، بێ سێ و دوو یەک لەو شاعـیـرانەی بە زەیندا تێـدەپەڕێ، نالی (١٧٩٧– ١٨٥٥ز) و شـیـعری نالی لە بەر چاودا خۆ دەنوێنێ.(٦) نالی شاعیرێکی دەستەبژێر و کاریزما و «گـەورەی کـوردە، بە دروسـتکەر، بناغـەدارێژ و داهێنەری قوتابخانەی شیعری کرمانجی خواروو/سۆرانی ناوزەد کـراوە»(٧). جێ دەسـتی ئەو شاعـیـرە بە سـەر پانتاییەکی گەورەی شیعری کوردی و قۆناغی خۆیدا بە ڕوونی دیارە، یان بە واتایەکی تر ڕەنگرێژ و بنیـادنەری ڕێبازی کلاسیزم بوو لە شیعریی کوردیدا.(٨) کاریگەری ئەو شاعیرە دوایی دەوامی کردووە و زۆربەی شاعیرانی کـلاسـیکی سـەر بە ڕێچکەی سێ کـوچکەی بابان لەو بلیمـەتە کـاریگەرییـان وەرگرتووە و بەم لەونە شـیـعری کـلاسـیکی سۆرانی بووەتە خـاوەن ناسنامـە و چیـیـەتی شیعری خۆی. ئەمە بەشێک لەو شاعیرە ناسراوانەن کە لە سـەردەمی نالی، یان پاش نالی خـاوەن بەرزە دیوان بوون لە ئەدەب و شیعری کوردیدا:

سـالم (١٨٠٠– ١٨٦٦)، کـوردی (١٨٠٩– ١٨٤٩)، مـەحـوی (١٨٣٠– ١٩٠٤)، حـەریق (١٨٥١– ١٩٠٧)، ئـەدەب (١٨٥٩– ١٩١٢)، حەمدی ساحێب قران (١٨٧٦– ١٩٣٦)، حاجی قادری کـۆیی ()، ناری (١٨٧٤– ١٩٤٤)، زێوەر (١٨٧٥– ١٩٤٨) پیرەمێرد (١٨٦٧– ١٩٥٠)، ئەحمەدموختار جـاف (١٨٩٧– ١٩٣٥) شـێـخ ڕەزا (١٨٣٥– ١٩٠٩)، فـایق بێکەس (١٩٠٥– ١٩٤٨) و دەیان شاعیری تر...تاد.

٢) مـەولـەوی تـاوەگـۆزیـش (١٨٠٦– ١٨٨٢ز/١٢٢١– ١٣٠٠ه.ق) یەکێکە لەو شاعـیـرە کاریزما و خاوەن (سەبک و سیاق) لە شیعری نەتەوەیی کـوردی، هەروەها کـە ئەحـمـەدی خـانی (١٦٥٠– ١٧٠٦ز) یەکـێکی ترە لەو شـاعـیـرانە کـە ویژدانی مێژوویی و چییەتی شیعری لیریکی کوردی لە باکوور دەستەبەر دەکات.

لە ڕەوتی شیـعـری هۆرامیـدا، ئەو نەمـامـەی کـە لە (هورمزگان)ـەوە گۆپکەی کردبوو و لە (بێسارانی)دا بوو بە باخـچـە و لە (صـەیدی)دا ڕەنگاڵە بوو و لە (مـەولەوی)دا گـەیشـتـە سەمـەر و لە پاش مـەولەوی و هەنووکـەش لە بەهرە و داهێناندایە. مـیکانیـزمـەکـانی شیعری پێش مەولەوی و سەردەمی مەولەوی و «هەموو قـوتابخـانەی دیالێکتی (گـۆران)! کـە بریتی بوون لە دیدێکی لیریکی و چەپکێ ڕێسای ئەدەبی و نەفەسێکی بەردەوام و لە یەکچوو»(٩) لە دەقە شیعری شاعیرانی پاش مەولەوی دەبینرێت وەک:

«شێخ محەمەد نەسیم مەردۆخی (١٣١٩ ک.م کۆچی کردووە) سەی یاقۆی ماهیدەشتی (١٣٢٦–...ک.م)، تاهیر بەگی جاف (١٢٩٥– ١٣٣٧ک.ه) مەلا هەسەنی دزڵی (١٢٧٥– ١٣٦٤ ک.م)، ئاغـە عـەنایەت (١٢٦٠– ١٣٣٥ ک.ه)، مـحـەمـەد ئەمین کـاردۆخی (١٩١٦– ١٩٨٢ ١٤٠٢/–١٣٣٣٧ک.م)، دانـا هۆرامی (١٩٣٤–١٩٧٩) سـەی تاهیـر هاشـمی (١٣٣٢– ١٣٣٧٠ –١٤١١/ ک.م)، شـێخ ئەمین نەقشبەندی (بێوەی، ١٩١٦–١٩٨٢/١٣٣٧–١٤٠٢/ ک.م)، عەبدوڵڵا ئەقدەسی (١٩٢٢– ١٩٦٨/١٣٤١– ١٤٠٦)، مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس، مەلا عەبدوڵڵای کـاتب (٢٠٠٤–١٩٣٢/ ١٣٥٣– ١٤٢٥ک.م)،



مەولەوی

میرزای هۆرامی، محەمەدی فەهیم، یووسف ڕەسووڵ ئابادی (١٣٣١- ١٣٨٧ک.ھ)، مەلا سادیق نگڵی()، موئمن یەزدانبەخش پاوەیی و دەیان شاعیری تر، کە خاوەن دیوانی شیعرن و لە کتێبخانە و ئەدەبی کوردیدا مەوجوودن.

**ڕسکان و فراژوێ بوونی قوتابخانەی نالی و سەردەمێکی هەستیاری سیاسی - فەرهەنگی مێژووی کورد**

٣) هەندێ بەڵگەی مێژوویی- ئەدەبی نیشان دەدەن، بزووتنەوەی ئەدەبی نالی (١٧٩٧- ١٨٥٥ز) و ڕەوتی شیعری کرمانجی خواروو لەگەڵ گەورە بوون و ڕادەی بەرزی ئاستی ئەدەبی کە بەر لە ئەوەی ڕەوتێکی سەردەمی خۆڕسک و هەڵقوڵاوی نیازی ئەدەبی بێ، زادەی سەردەمێکی هەستیار و ململانێکی سیاسی لەگەڵ میرنشینی (ئەردەڵان) لە پێناو بەرژەوەندی بەدەست هێنانی دەسەڵاتی زوانی بووە. «نالی لە ناو شارێکی تازە پایتەختی وەک سلێمانی و ناوەندی دەسەڵاتی باباندا دەژیا کە لەو کاتەدا هەر نزیکەی (٤٠- ٥٠) ساڵێک دەبوو دروست کرابوو، دەبوو نالی بە گیانی تازە و شارستانییانەی ئەم پایتەختە تازەیەوە کە لە دیدی (نالی)یەوە تاقانە میرنشینێکی قەومی داهاتووی نالی بوو، ئەدەب و فەرهەنگێکی تازەش لەگەڵ خۆیدا پێشکەش سەردەمەکەی بکات.

**لە بیرم دێ «سولەیمانی» کە (دارالملک)ی «بابان» بوو**
**نە مەحکوومی عەجەم، نە سوخرە کێشی ئالی عوسمان بوو...(١٠).**

نالی لە ڕوانگەی هەڵسەنگاندنی توانایی بێ سنووری دیالێکتی ناوچەکەی خۆیەوە کە دڵنیا بوو توانایی تەقاندنەوەی زۆری لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە.(١١) و دەرکی بە هەبوونی دەسەڵاتێکی نەیار وەک قوتابخانەی ئەدەبی ڕەسمی- دیوانی میرنشینی ئەردەڵان کردبوو و هەوڵێکی فەرهەنگی لە قاوغی زوان و چێژی دەسەڵاتی سیاسی دابوو بۆ ئەوەی کە ئەو دەسەڵاتە سیاسی- ئەدەبی (گۆران) و ئەردەڵانە بسێنێتەوە کە لە مێژە سەقامگیری بە خۆیەوە بینیبوو، هەم دۆخی هێژموونی سیاسی و دەسەڵاتداری بە بەبەکان ببەخشێ و هەمیش دیالێکتی سۆرانی ناوچەی سلێمانی ببووژێنێتەوە و بازنەکەی بەربلاوتر بکات. بە ئاگاداری و شارەزایی لەم دۆخە و هەست بە دەسەڵاتێکی بەرانبەری تر، بە تایبەت شیعر و ئەدەبی هۆرامی، وەک شاعیرێک و بکەرێکی وریا و کارامە، زانیویەتی لەم نێوەندەدا، چۆن کایەی زوانی بەکار بهێنێت و واقیعەکان بقۆزێتەوە. لەم بەیتەدا:

**کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە، خۆکردییە**
**هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا(١٢)**

لە تێگەیشتنی مندا یەک لە تەئویل و ڕاژەکانی ئەم بەیتە ئەوەیە: نالی ڕەندانە و زیرەکانە لەفزی یەک چەشنی جیناسی لێکدراو و تەواو و ناتەواوی«خۆ کوردی، خۆکردی»ی بەکارهێناوە. دیوی(خۆکردی) هێمایەک و پەیامێک بۆ وێنای بەرجەستەکردن، هەڵاوێردن، بەدەسەڵات کردن و چییەتی دیالێکتەکەی لە ڕوانگەی دەسەڵاتی داهێنانی هونەری -زوانی خۆیەوە و دیوی(خۆ کوردی)یش بۆ نواندنی باقی(دیالێکتەکان) لە زوانی کوردیدا کە جۆرە نرخاندن و جەختاندنێکی شاعیرانەیە بۆ دابین کردنی مەبەستی خوازراو.

لە پێناو درەوشانەوەی بزووتنەوەکەیدا، لە ماوەیەکی زۆر کورت و چاوەڕوان نەکراودا، توانی سنوور و جوگرافیای دیالێکتەکەی بەخێرایی بەرفراوانتر بکات و وەک ئاگر و پووشوو، بە ناوچەکانی گەرمیان و کوێستان و موکریان و ئەردەڵاندا بتەنێتەوە. کە ئەم کارە، لە هەمان کاتیشدا و بە تێپەڕینی ڕۆژگار بووە مایەی تەنگ پێ هەڵچنینی دیالێکتی گۆران کە ڕاستەوخۆ، سنووری لەگەڵ سنووری ئەم دیالێکتە تازە و گورجەدا تێکەڵ و هاوبەش بوون.(١٣)

لە شیعرێکدا ئاماژە بە زوانی ئیهام و توانج دەدات بە نموودی ئەم دەسەڵاتە و دەڵێ ئەمڕۆ دیوانی حوکمڕانیم هەیە و حوکمی ئەم سێ وڵاتەی لێوە دەکەم:

**فارس و کورد و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە**
**نالی ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە دیوانی هەیە...(١٤)**

پێشتر نالی ئەم کۆسپەی لە ناواخنی ئەدەبەکەیدا دەرک کرد بوو کە بە پێچەوانەی تێکڕای شاعیرانی پێشینەی نیشتمانەکەی خۆی و شاعیرانی نەتەوە دراوسێکانییەوە کە هەموویان لەبەر کلاوڕۆژنەی گەنجینە و خەرمانی بە بڕشت و دەوڵەمەندی پێشینەی خۆیانەوە پێگەیشتوون و درەوشاونەتەوە، بەڵام نالی و قوتابخانەی شیعری کلاسیکی کرمانجی خواروو، بە تەنیا و بە بێ پشتیوانی گەنجینەیەکی دێرینە و دەوڵەمەند و بە بێ دووبارەکردنەوەی تاقیکردنەوەی شیعری پێش خۆی، بەڵکو لە ناو گەنجینەی فەرهەنگێکی هەژار و زمانێکی دیالێکتدا، سەری هەڵداوە و درەوشاوەتەوە(١٥).

کەچی لە هەمان کاتدا شیعری هۆرامی دۆخێکی تری هەبووە، ئامادەییەکی جەوهەری سەقامگرتوو و درێژخایەن و نەپساو. هەندێ لە دیالێکتەکانی زمانەکەی، وەک دیالێکتی کرمانجی ژووروو، چەند سەدەیەک دەبوو لە دوای درەوشانەوەکانی مەلای جزیری و ئەحمەدی خانییەوە، ئیتر پردی پێوەندی و داهێنان و بەخشینی لەگەڵ خوێنەراندا پساندبوو. لەبەر ئەوە تەنیا دیالێکتێکی بەردەوام و زیندوو کە نزیکەی (شەش سەدە!) دەبوو، ئەدەبی پێ دەنووسرا، بە تەنیا هەر دیالێکتی (گۆران) بوو، کە ئەم دیالێکتەش لە سەردەمی نالی دا، لە جوگرافیایەکی یەکجار بەربڵاوی ناوچەکانی کرمانشان و ئەردەڵان و موکریان و شارەزوور و کەرکووکدا، لە لووتکە و درەوشانەوە و داهێنان و بەخشیندا بوو»(١٦).

## تەوس، تارۆز و شەڕە شیعر نموودی ململانێیەکی بەرچاو

نالی شاعیری گەورە، لە ژێر کاریگەری ئەو بەخشەندەیی ئەدەبییانە و قووڵکردنەوەی دژبەری سیاسی و خەستکردنەوەی دۆزەکان، قەسیدەیەکی تەوسئامێزی(خەونامە) بۆ مەستوورەی ئەردەڵانی (١٢٢٠- ١٢٦٤ ک.م) نووسیوە و وێڕای دەرخستنی خاڵە نەرێنییەکان بە زوانی لاقرتێ، مەبەستەکانی خۆی بۆ ئەو دەربارە دەربڕێت کە ئەمە هەم بەڵگەیەکە بۆ دان پیانانی نالی بە کەسێتی بەرزی ئەدەبی مەستوورە لەو میرنشینەدا و هەمیش نموودی بەرچاویەتی ململانێی سیاسی، تەنانەت بەرانبەرکێی ئەدەبی لەگەڵ بنەماڵەی(ئەردەلان) و قوتابخانەی ئەدەبی هۆرامی:

**مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ**
**هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک و عیتابێ... (١٧)**

سالم شاعیری گەورەی سەردەمی بەبەکانیش (١٨٠٠- ١٨٦٦ز)، بەتاڵ دانەنیشتووە، لە بەیتێکدا نموودی ئەم ململانێیەی ئاوا خستووەتە ڕوو:

**کەڕ و فەڕ با کەم بکا (والی) بە فەوجی (چێش کەروو)**
**پشت بەندی (لەشکری وەندات و جافان) هاتەوە...**

لێرەدا (والی) حاکمی ئەردەڵان و (چێش کەروو)یش فەوجی شاعیرانی هۆرامییە کە لەو سەردەمەدا خاوەن دەسەڵاتی ئەدەبی-دیوانی میرنشینی ئەردەڵان بوون، لە بەشێکی دی جوگرافیای سیاسی کوردستان سەر بە کاسێتی دەسەڵاتی قاجارەکان و لەشکری وەندات و جافانیش دەرباری (بابان)ە، شاعیرانی ئەو ڕێچکە ئەدەبییە کە دەبنە نەیار و بەرانبەری دەرباری ئەردەڵانەکان و قوتابخانەی مەولەوی. سالمی شاعیر لەم بەیتەدا بە تەوسە زوان، لە ئاوابوونی دەسەڵاتی ئەردەڵان و کزبوونی شێوەی هۆرامی دەدوێ و بە لەحنێکی حەماسی- پاڵەوانی مژدەی هاتنەوەی لەشکری ئەمارەتی بابان و بریسکانەوەی شاعیرانی ئەو دەسەڵاتە دەدات.

ئەمە لە کاتێکدایە کە من ئاوا هەڵوێستێکی دەمارگرژانە و تەوسئامێز شک نابەم لە قوتابخانەی شاعیرانی هۆرامی بەرانبەر بە شاعیرانی بابان و دەسەڵاتدارانی ئەو میرنشینە، ئەمە ڕەنگە لە سەقامگرتوویی ئەم ڕەوتە و متمانە بە خۆ و بایەخدان بە کاری نابی ئەدەبی، لە هەمووی گرنگتر پارێز لە هەر چەشنە دووبەرەکی سەرچاوەی گرتبێ.

## گۆران و بادانەوە بۆ گەنجینەیەکی دێرین و شۆڕشێکی سەردەمیانەی ئەدەبی

٤) وێڕای ئەو کارکردە زوانیانە لە فەلسەفەی سەرهەڵدانی کوردی کرمانجی خوارووودا کە باسمان لێوەکرد، گەشەی ئەدەبی کلاسیکی نالی و پاش نالی، نەیتوانی کاریگەری ئەوتۆ بە سەر زەمینەی تازەگەری لەشیعری پاش خۆیدا دابنێ، ئەمەش ناهاوسەنگی لەگەڵ کاریگەرییەکانی قوتابخانەی مەولەوی و شیعری هۆرامی دەنوێنێ، هەناسەی بەردەوام و سامانێکی بەپێزی ئەدەبی درێژخایەن، یەکەمین مەرجن بۆ درەوشانەوە و بەردەوامی

و کارادنەوەی ڕەوتێکی ئەدەبی کە پێش نالی بۆشایی بووە. نیمایۆشیج (١٢٧٦-١٣٣٨ ک.هـ) باوکی شیعری ئێستای فارسی، بە پشت بەستن بە یاسای گۆڕانکاری و هەبوونی گەنجینەیەکی درێژخایەنی (١٠٠٠) ساڵە، دەستی کرد بە تازەگەری لە شیعری فارسیدا و چەندان ڕەهەندی بە دوو خۆیدا هێنا. نیما سەرەتا دەستی بە وتنی شیعری ئەوسایی(١٨) کرد و پاشان بە دانانی شیعری«ئەفسانە»(١٩) پردێکی ئەستووری نێوان شیعری ئەوسا و ئێستای فارسی دروست کرد و بەم شێوە بوو بە باوکی نوێخوازەکان و هەمیش خاوەن سامانێکی دۆڵەمەندی شیعری سەردەم و ئاوانگارد بە ناو(مانیفێست)ی شیعری نوێی فارسی.

سەرهەڵدانی نالی، خۆی لە خۆیدا و بە پێی ئەو ئامانجانە کە ڕێڕەو کراون، دەسکەوتێکی بە نرخ بووە بۆ درەوشانەوەی کوردیی کرمانجیی خواروو، دەسەڵاتێک کە لەم دوو سەد ساڵەی دواییدا، تۆز و گەردی کەڵەکە بووی دێرینە و زۆری لەسەر خۆی تەکاند و وەک دیالێکتێکی شێوە یەکگرتووی هاوچەرخانە هاتە کایەوە(٢٠)، هەوڵەکەی لە پێناو دەرک بە دەسەڵاتێک و پێداویستی پایتەختێکی تازە(٢١) بۆ تەنگ هەڵچنین بە قوتابخانەی زیندوو و سەردەمیانەی «فەوجی چێش کەروو» لە پایتەختی ئەردەڵانەکان درەوشایەوە، تەنانەت هۆگر و ڕاهاتووی ئەم جۆرە شیعرەش نەبوو، ژمارەیەکی زۆر کەمی توێژێکی تایبەتی خوێندەوارانیش تێ دەگەیشتن(٢٢)، بۆیە لەم بەستێنەی شیعر و ئەدەبدا، هەستانەوەیەکی ئەدەبی تازە و نامۆ ڕووی نەدا، ئەو توخمە ناکوردییانە کە نالی کردبووی بە دەسمایەی داهێنانی شیعرەکەی خۆی هیچی لەگەڵ ڕوحی ناخۆئاگا و نەفەسەکانی ڕاهاتووی ڕابوردووی نەتەوەکەی هاوتراز و هاوچەشن نەبوو. عەبدوڵلا گۆران (١٩٠٤-١٩٦٢ز) باوکی شیعری نوێی کوردی سۆرانی، هەستی بەم بۆشاییە کرد، بۆیە ژیرانە بادانەوەی بۆ گەنجینەی شیعری هۆرامی کرد و لەو ئامێزەدا ئۆقرە و ئاسوودەیی بە خۆوە گرت.

بە پێی بەڵگەی نرخێنراوی ئەدەبی و وتەکانی خودی مامۆستا گۆران، ئەو «تەقینەوە»یە دەبێتە دژەکردار (پارادۆکس)ێک و وێنای «دینامیزم»ێک بۆ «درەوشانەوەی» شیعری هۆرامی پاش مەولەوی لە لانکەی خودی گۆرانی نوێخوازدا، ئەوەش مەسەلەی بە کارهێنانی کێشی پەنجەیی و خۆ ڕزگار کردن لە عەرووز و فۆڕمە سواوەکانی کۆن بوو کە لە شیعری فارسی و عەرەبی لە مێژە باو بووە، ئیتر ڕەوشێکی بێ سوود بە ئەژمار دەهات و خەریک بوو دەخرایە پەراوێز و بۆتەی فەرامۆشی، کەچی نالی ئێستا هانای بۆ دەبرد و دەیکردە بناغەی داڕشتن و هۆنینەوەی شیعری کرمانجی باشوور. «ئەمە لە ڕووی گۆڕینی مۆسیقا و سەربەستی شاعیر و دەربڕینی هەست و خواستەکانی شاعیرەوە بایەخێکی بنەڕەتی بووە بۆ گۆران و خۆی لەخۆیدا بوو بە شۆڕشێکی گەورەی مۆسیقا و کێشی شیعری کوردی، بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییە تێکڕا هەموو شیعرەکانی مەولەوی و بەرهەمی ئەو شاعیرانەیە کە بە لەهجەی هەورامی و لەسەر کێشی (٥+٥) شیعریان هۆنیوەتەوە. وەک گۆڕینێکی بنەڕەتی و شۆڕشێکی سروشتی و ئیقلیمگیر و سەرکەوتووی مۆسیقای کوردی لە عەرووزەوە بۆ کێشی ڕەنگاوڕەنگی خۆماڵی(٢٣)» ئەم شۆڕشە بەمەوە نەوەستا و لە بەردەوامی ئەو بزاڤەی (گۆران)دا بەرەکانی شیعری هاوچەرخی کرمانجی خواروو یەک لە دوای یەک سەریان هەڵدا و بوونە پژگە و پرشەکانی تری ئەو درەوشانەوە. وەک «ڕوانگە» و «کفری» لە دەیەی (١٩٧٠)ی ز و «تەلیعی» و «زناک»یەکان لە دەیەی (١٩٨٠)ی ز و بەرەی «ڕادیکاڵ»تر لە دەیەی (١٩٩٠) و... تاد.

### لادان لە کەرەستەی زوانی باو و هەوڵ بۆ تەڕ و پاراوێتی زوانی نەتەوەیی شیعر

٥) نالی لە تەشک (فۆڕم) و کەرەستەی زوان و پێکهاتەدا، زۆرتر لە ڕێسای عەرەبی و فارسی کاریگەری وەرگرتووە. لە دەقەکانیدا پتر لە سەدی هەشتای توخمە زوانییەکانی، ڕاستەوخۆ وەرگرتەن لە زوانی عەرەبی و...تاد، ئەمەش وتە تۆزقاڵێ لە نرخناسی و چەشنی کەشف و داهێنان و سلووکی هونەری و شاعیرانەی نالی کەم ناکاتەوە، بەڵام وەک واقیع لە پێکهاتەی دیوانەکەیدا ئەم دیاردەیە بە ڕوونی و زەقێتی خۆی دەنوێنی. لەم بەیتەدا جگە لە (لە، ئاشنا، بێ، کەس و نەما) هەموو وشە سەرەکییەکان عەرەبی ڕووتن.

**زاهیر و باتین لەسەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز**
**ئاشنای سیرڕی قەلەم بێ، غەیری نالی کەس نەما(٢٤)**

لە بەرانبەردا شیعری قوتابخانەی هۆرامی بە تێکڕا و شیعرەکانی دیوانی مەولەوی زۆربەیان ملوانکەی وشەی ڕەسەنی کوردین لە مرواری شێوە زوانەکان بە تایبەت

کوردی هۆرامی، ئەگەر بە ڕەچەڵەک وشەی عەرەبی، یان فارسی تێدا بێت ئەوە لە پاڵفتەخانەی زوانی کوردیدا، بە گۆڕینی دەنگەکان، ناسنامە و کەسایەتی کوردییان پێدراوە. بۆ وێنە «صبح، زحمت، زعیف، محبت، محنت و...تاد» کە عەرەبین، شمەکیان گۆڕدراوە و کراون بە «سوب، زامەت، زایف، موبەت، مەینەت و...تاد».

**هیچ نەبەردەن نام خەستەی دەردەکەش**
**نەکەردەن خەیاڵ «مەینەت» وەردەکەش...(٢٥)**

ئەمە ڕەنگە گەورەترین خزمەت بێت کە شاعیرێک بە دەوڵەمەندی زوانی یەکگرتووی کوردی کردوویەتی. ئەم خاڵە لە ژێر نیگای تیژبین و هونەری گۆڕاندا بزر نەبووە و بە شەفافییەت لێی موتەئەسیر بووە و لە دەراوی زوان پاراوی شیعری هۆرامییەوە، مەزنترین خزمەتی بە وشەی زوانی کوردی کرمانجی خواروو کرد لە حەوزەی شیعرە تازەکانیدا. لەو دەمەدا «هەموو دەزانین ڕۆشنبیرەکانی ساڵانی بیست و سییەکان پاراوی زمانی فارسی و تورکی بوون و تەواو مەستی ئەو دوو سەرچاوە بوون و زمانی عەرەبییش دوابەدوای ئەوان لە شەپۆلی کارتێکردندا بوو. لەو ڕۆژگارەوە مەسەلەی بە کوردی پەتی نووسین و بژارکردنی زمانی کوردی لە وشەی بێگانە سەری هەڵدا و بایەخی پێدراوە. ئەمە بوو بە گشتی جۆری ناسک و سەرکەوتووانەی شێوازی شاعیر بۆ تەڕ و پاراوی زمان و کوردیی پەتی و وشەی ئاوازداری کوردی و ڕوونی واتا و مەبەست.».(٢٦)

٦) ئەم بەراوردکارییە تۆزقاڵێک لە بەهرە ئەدەبی-جوانیناسی-تەکنیکییە هونەرییەکانی نالی و پاش نالی کەم ناکاتەوە، لەم وتارەدا ئەو پارادۆکسەمان ساغ کردەوە کە گوایە «گرکانی نالی و تەقینەوەکەی پاش نالی، تەنگی بە شیعری هۆرامی هەڵچنی، یان دا تەپی، یان لە مەولەوی کۆتایی پێهات»، لەم گوزارەدا، ئەم ڕەوتە دەگاتە«عەرشی عیزەت» و «مەولەوی» و «پاش و مەولەوی» دا دەبەزێتە «فەرشی زیللەت». ئامانجی هەڵسەنگاندنی ئەم وتارەش ئەوە بووە کە ڕوون بکاتەوە، ئاکامی بۆچوونەکان پێچەوانە و ئاوەژوو کراون.

٧) ئەگەر ئەم ترۆپکە فەرزییەگەلە بەڕاست بزانین کە بزاڤی شیعری مەولەوی و پاش مەولەوی، تەنگی پێهەڵچنراوە، داتەپیوە و پووکراوەتەوە، یان کۆتایی پێهاتووە، ئەوە «مەولەوی» دەبێتە شاعیرێکی خەسێنراو و بێ بەهرە و مراوی(٢٧) کە هزرێکی «نەزۆک» و زوانێکی «قسر»ی هەبووە و نەیتوانیوە پاش خۆی ڕۆڵێکی ئەرێنیی لە شیعردا ببێت، خۆ هیچ بەڵگەیەک ئەمە ناسەلمێنێ، دەقەکان دەڵێن کە مەولەوی شاعیرێکی کاریزما، خاوەن شێواز و دیوانەکەی شاکار و لووتکەی ئەدەبی بووە و لە سوورەت و سیرەتی شاعیرانی سەردەم و پاش خۆی و ئەمێستاکەش، کاریگەری بەرچاو و هەست پێکراوی داناوە.

**دمایینە**

١- داهێنان، نووسین و توێژینەوەی زانستی بە میتودێکی ئەکادیمیانە، نیازێکی سەردەمیانە و ژیانبەخشە بە تێکڕا بۆ حەوزەی زوان، شیعر و ئەدەبی کوردی. پێچەوانەش کاری چەقبەستوو و هەڕەمەکیانە، چاوبەست کردنە لە واقیعەکان و دوورخستنەوەیە لە پرۆسەی زانستیی نووسین و فەلسەفەی داهێنان و... تاد.

٢- بە پێچەوانەی کاریگەریی جەوهەری و بنەمایی شیعری بەردەوامی هۆرامی لەسەر شۆڕشی تازەگەری گۆران، بۆ خودی هۆرامی ئانتی تێزێکی(دژواز) دەنوێنێ. بە هۆی ئەو چەپکە خەسڵەتانە وەک قابیلییەتی دەنگتەوەری، ئەندامی و وردەکاری و فرەچەشنی ئەدەبی(٢٨) کە تێیدا دەبینرێت، هەم شیعرەکەی، نەگۆڕ مایەوە و گۆڕانکاری نوێی نەگرتە خۆی و هەمیش شاعیرانمان بە هۆی جەزبەی هێژمونی شەپۆلەکانی شیعری تازەی سۆرانی، غافڵ بوون لە پرۆسەی گۆڕانکاری بنەمایی، بەم بۆنەوە شاعیرێکی تەواوکەر و گۆران ئاسا و کاریزمای لێ هەڵنەکەوت، بەڵام بەم حاڵەشەوە لەم دواییەدا شیعری تازەی هۆرامی لە ژێر گوژمی ئەو شەپۆلانە، لە دوو قۆناغدا کەوتووەتە سەر ڕێ و هەبوونی خۆی لەو ئاستەدا چەسپاندوە:

ا) قۆناغی ڕێسا شکێنی برگە(عوسمان هۆرامی، دەیەی ١٩٧٠ز / ١٣٥٠ک.ه)(٢٩)، کە دەبێتە حەڵقەی نێوان شیعری ئەوسا و ئێستای هۆرامی.

ب) قۆناغی سەرەکی دەسپێکی شیعری ئەمڕۆ بە تەئسیر لە قۆناغی پێشوو. ئەم مینی قۆناغانەش دوایی سەریان هەڵدا: تەجروبەیەکی تازەتر، جەلیل عەباسی(سەرەتاکانی ١٣٦٠ ک.ه)، ساکاری و...، کولسووم عوسمانپوور(دەیەی ١٣٧٠ ک.ه)، شیعر بۆ شیعر، ڕەوف مەحموودپوور (سەرەتاکانی ١٣٨٠ ک.ه)، و پرۆسەی بەردەوام بوون(٣٠).

**پەراوێزەکان:**

١- «وەڵێنە» و «دمایینە» دوو وشەی هۆرامین، پێشتر پێشنیازکراون بۆ هاوسەنگی «دەسپێک، پێشەکی» و «ئەنجام، کۆتایی».

٢- لە بنەمادا دیالێکتیک وشەیەکی فەلسەفییە لە ڕەگناسیدا ئەم وشە بە مانای شێوازی وتووێژە و بە کەسانێک کە سەر بابەتێک باسی درێژخایەن دەکەن، یان زوانزان و قسەکەرێکی خاوەن توانایین کە پێیان دەڵێن «دیالێکتیسین»، بەڵام لێرەدا مەبەست نە ئەم مەدلوولەیە و نە واتا فەلسەفییەکەی، بەڵکو مانای «بزاڤ، جمە و جووڵە و گۆڕان»ی لێوەرگیراوە، جمە و گۆڕانێک کە لە هەموو عالەمی کەوندا و لە هەموو دیارەکاندا وجوودی هەیە، ئەمەش لە نەفسدا دەبێتە بناغەی دیالێکتیک. (ژرژ پولیتسر، اصول مقدماتی فلسفە، ل١٢١)

٣- تەشک و دلێنە» هۆرامین بۆ فۆرم و ناوەڕۆک پێشنیاز کراون.

٤- ئەمەش ئەو حەوت قۆناغە لە شیعری هۆرامیدا:

ا) قۆناغی «سەرهەڵدانی شیعری هۆرامی»، (دەیەکانی سەدەی هەوەڵی ک.م). شیعری «هورمزگان» و «ماریفەتوو پیرشالیاری، ماریفەتی پیرشالیار» و... تاد.

ب) «یارسان، وێنای شیعری ئاییني هۆرامی»، (نیوەی دووەمی سەدەی دووەم تا سەدەی یازدەم ک.م).

ج) قۆناغی بێسارانی نموودی «بزاڤ و داهێنان»، (سەدەی١١- ١٢ ک.م).

د) سەیدی هۆرامی، ڕێچکەی«بەردەوامی و فرە دەنگی»، (سەدەی ١٢- ١٣ ک.م).

ه) مەولەوی تاوەگۆزی، ڕەوتی «هارمۆنیای فۆرم و ناوەڕۆک» (سەدەی ١٣- ١٤ ک.م).

و) پاش مەولەوی (سەدەی ١٤ و دوایی) و بەردەوامی شێوازی کلاسیک.

ز) دەسپێکی نوێخوازی شیعری ئێستای هۆرامی، بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە محمدپور عادل، تەرح، ل(٩) و (٢١).

٥- * جگە لە هەوڵی بڵاوکردنەوە و بە دەسەڵات کردنی بازنەی دیالێکتی کرمانجی خوارو، کە پێشتر لە لایەن هەندێ نووسەری باشوورەوە دراوە، وەک وتارەکەی کاک محەمەد حەمە باقی، نالی کێیە و چۆن بۆی بنوارین، زرێبار ل٢٣٥- ٢٣٦، کە بۆ نووسەری ئەم دێڕانە سەرچاوە و ژێدەرێکی سەرەکی بووە و خوێندنەوەی لەسەر کراوە. لەم ڕاستادا وتارگەلێکی تر نووسراون:

١- فەرزاد میرئەحمەدی، لە سیروانی ژمارە(٤٠)، بۆ ناساندنی شاعیرێکی هاوچەرخی هۆرامان لە وتارێک بە ناوونیشان «شیعری هاوچەرخی هەورامان» نووسیویە: شیعری هۆرامی لە مەولەویدا پەنگ دەخواتەوە و زنجیرە شیعرییەکە دەپچڕێت و وەک شیعری زاراوەی سۆرانی دەوام ناکات و لە دنیای شیعریدا نوقم دەبێت.

٢- فەرشید شەریفی لە هەسارێوە وەرم زریا نووسیویە: لە دوای مەولەوی سالانێکی دوور و درێژ بوو وەک گۆمێکی مەنگی لێهاتبوو.

٣- ڕەوف مەحموودپوور لە سیروانی ژمارە (٧٦٢) و شرۆڤەی ڕەوتی ئەدەبی پاش نالی و مەولەوی، پێگەی ڕەڕنەی ئاسۆ، پێیوایە: لە دیالێکتەکەی! (هەورامی!) بەو هەموو پێشینە دەوڵەمەندەوە دووچاری وەستان و تەنگەتاوی، تەنانەت تەنگژە و داتەپانیش هات ئەمە خەسارێکی گەورەیە لە ئەدەبی کوردیدا.

٦- یعقوبی عەبدولخالق، زرێبار ژ (٨٠-٧٩)، ل٣٠.

٧- د. عەبدوڵڵا خدر مەولود، ل(١٩).

٨- ڕەوف عوسمان، وەرزنامەی زرێبار ژ (٨٠-٧٩) ل١٣٨.

٩- محەمەد حەمە باقی، هەمان ل٢٣٥.

١٠- نالی دیوان، ل٣٩.

١١- هەمان سەرچاوە محەمەد حەمە باقی، ل٢٣٥-٢٣٦.

١٢- نالی دیوان، ل١٠٧.

١٣- هەمان سەرچاوە محەمەد حەمە باقی ل٢٣٥- ٢٣٦.

١٤- دیوانی نالی، ل٥٧٧.

١٥- هەمان سەرچاوە محەمەد حەمە باقی، ل٢٣٦.

١٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٣٥- ٢٣٦.

١٧- دیوانی نالی، ل٦٠٣.

١٨- غیاسی، د محمد تقی، نیمایوشیج، ل١٠٤-١٠٦.

١٩- حقوقی محمد، ل١٢٧.

٢٠ - هەمان سەرچاوە محەمەد حەمە باقی، ل٢٣٥-٢٣٦.

٢١- هەمان سەرچاوە محەمەد حەمە باقی، ل٢٣٥-٢٣٦.

٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٣٥-٢٣٦.

٢٣- حەمە حەمە ئەمین قادر(کاکەی فەلاح)، ل(٣٤-٣٥).

٢٤- دیوانی نالی، ل١٣١.

٢٥- دیوانی مەولەوی، ل٢٧٤.

٢٦- حەمە حەمە ئەمین قادر (کاکەی فەلاح)، ل(٤٧).

٢٧- مراوی هاوسەنگی وشەی (عقیم)ە لە فارسی و عەرەبیدا، لە ناوچەی هەجیجی هۆرامان باوە، دەستەواژەیەکە پێکهاتە لە مر(لە ڕەگی مردن)+ئاو+ی نسبت، یانی پیاوێک کە ئاو مردوو بێ و منداڵی لێ نەکەوێتەوە.

٢٨- بڕوانە: ١- کتێبی ڕەنگاڵەی ل(٧) ٢- کتێبی تەرح ل(١٧٣) ٣- وەرزنامەی زرێبار، ژ (٧٦-٧٦)، ل(٦١).

٢٩- مامۆستا عوسمان هۆرامی لە ساڵەکان (١٩٧٢ز) دەستی کردووە بە دانانی دەقی ڕێساشکێنی(٥+٥) برگەی شیعری هۆرامی، لە گۆڤاری نووسەری کورد «(گۆرانییە نەمرەکاما

ماچمێ، ١٩٨١ز و وەشەسیاییما جە گەردوونی فراوانتەرا، ١٩٨٣ز) چاپ و بڵاو کراونەتەوە. «سەرچەمە و عەشقی نەژادی» شیعرێکی درێژ لە (١٤) بەنددا لە گۆڤاری زرێباری ژ (١٧-١٨ی جۆزەردانی ساڵی (٢٠٠١ ز/ ١٣٨٠ی ک.ه) چاپ و بڵاوکراوەتەوە هەر لە ڕاستای بەردەوامی شیعر وتنەوەی بەم شێوازە لە ڕێکەوتی (٢٠٠٩/٥/١)، (١٥) پارچە شیعری درێژی دەسنووسی دراون بە من و لە ئارشیڤدا ئامادەن، دوور نییە کە فرەیێ لە شیعرەکانی بەلای خۆیەوە ئارشیڤ کرابێت.

٣٠- جگە لە ئەو دەقانە لەو شاعیرانە کە خاوەن دەق بوون و ئاماژەمان پێ دان و ئێستاش بەردەوامن، چەند دەقی چاپ کراومان لە نێوان ساڵەکان(٨٤ تا ٩٢ ک.ه) هەیە: وەک کۆشیعری هەسارێوە وەرم زڕیا(٢٠١٢ ز) لە ڕەوف مەحموودپوور، هەنگی ڕوح (١٣٨٤ک.ه) و هاوار و بێدەنگیم (١٣٨٧ ک.ه)، لە سابیر سەعیدی، کۆمەڵە شیعری ئەمڕۆی پاوە و هۆرامان (١٣٨٧ ک.ه) و بەسەی جگەرێ غەریبەنە وەگێڕراو لە فارسی بۆ هۆرامی، ئاشنا عەباس مەنش (١٣٩٢ ک.ه)، هەناسەی کاڵ (١٣٩٠ ک.ه) و دەفتەرێکی تازە بە ناو سۆسکە قەتیسەکا (زستانی ١٣٩٢ ک.ه) لە سابیر عەزیزی، شارۆ ڕۆشنایی (١٣٩١ ک.ه)، ئومێد لەحەبیبی، پژگیا (٢٠١٣ ک.ه)، لە نامیق هۆرامی و...تاد ڕەنگە بەرهەمی تازەتریش چاپ کرابێت و من ئاگام لێیان نەبێ، بەڵام ئاگادارم هەندێ شاعیر ئەمێستاکە خەریکی ئامادەکردنی دەفتەرە شیعرن کە باری بۆتیقا و فەنی شیعرەکەیان چی بێ و چۆن بێت، ئەوە دوایی بخوێنرێتەوە، ئەنجا بڕیاری لەسەر بدرێت.

**سەرچاوەکان:**


**(١) حقوقی محمد، شعر نو از اغاز تا به امروز، شعر افسانه نیمایوشیج، نشر روایت، تهران ١٣٧١ ک.ه.**

**(٢) حەمە حەمە ئەمین قادر(کاکەی فەلاح)، کاروانی شیعری نوێی کوردی، ب یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٨ ز.**

**(٣) د. عەبدوڵڵا خدر مەولوود، لێکۆڵینەوەیەک لە شیعرە ئایینی و سۆفیگەری و فەلسەفییەکانی نالی، چاپخانەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٧ ز.**

**(٤) ژرژ پولیتسر، اصول مقدماتی فلسفه، وەرگێڕان جهانگیر افکاری، تاران ١٣٥٨ ک.ه.**

**(٥) ڕەوف عوسمان، کاریگەرێتی دەقەکانی قورئان لە هۆنراوەکانی نالی دا، زرێبار ژ (٧٩-٨٠) ل(١٣٨)، پاییز و زستانی (١٣٩١)، تایبەت بە نالی.**

**(٦) سەجادی عەلائەدین، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥٢/١٣٧١ک.**

**(٧) شیعری هاوچەرخی کوردی هۆرامی لە وەرزنامەی زرێبار، ژ ٧٥-٧٦، زستانی ٩٠.**

**(٨) غیاسی د محمد تقی، شعر عەبدولله تاهیر و کنیزک نیمایوشیج، درامدی بر سبک شناسی ساختاری ل١٠٤-١٠٦.**

**(٩) گۆران عەبدوڵڵا، بەهەشت و یادگار، ، چاپخانەی کامەرانی ١٩٧١ز.**

**(١٠) مەحموودپوور، ڕەوف، شرۆڤەی ڕەوتی ئەدەبی پاش نالی و مەولەوی، وێب زەڕنەی ئاسۆ.**

**(١١) مەحموودپوور، ڕەوف، سیروان شمارە (٧٦٢) شەمە (٩٢/٩/١٩).**

**(١٢) مەحموودپوور، ڕەوف، هەسارێوە وەرم زڕیا، هەولێر ٢٠١٢ ز.**

**(١٣) محەمەد حەمە باقی، نالی کێیە و چۆن بۆی بنواڕین، زرێبار ژ (٧٩-٨٠) ل(١٣٨)، پاییز و زستانی (١٣٩١)، تایبەت بە نالی.**

**(١٤) محەمەدپوور، عادڵ، ڕەنگاڵە، جمەو شیعرە و ئارۆ هۆرامی، چاپ ئاکام، سلێمانی ٢٠١٢ز.**

**(١٥) محەمەدپوور، عادڵ، تەرح، جریان شناسی شعر کردی هۆرامی، نەشر ئیحسان، ل(٢١)، تاران، ١٣٩٢ی ک.ه.**

**(١٦) مودەڕیس عەبدولکەریم و فاتح مەلاکەریم، دیوانی شیعری نالی، مرکز نشر و ئەدەبیات کوردی، ارومیە، ١٣٦٤ ک.ه.**

**(١٧) مودەڕیس مەلا عەبدولکەریم، دیوانی مەولەوی، پەخشکاری کوردستان، ١٣٧٨ ک.ه.**

**میر ئەحمەدی فەرزاد، شیعری هاوچەرخی هەورامان، حەوتوونامەی سیروان، ژمارە (٤٠).**

**وەرزنامەی زرێبار، شیعری هاوچەرخی هەورامی لە ژ(٧٦)، ل(٦١).**